

# کەڵەشێرو ڕێوییەکە

وەرگێڕانی : عەزیز ڕەشید هەریری

## پەشیمانیی ئەسپێک

لە کۆنەوە ئەسپێک هەبوو، وەکو زۆربەی گیانداران لە چۆلەوانی دەژیا...

منداڵە ئازیزەکان؛ ڕۆژێکیان بازرگانێک داوای لێ کرد بچێتە لای ئەو و گالیسکەکەی بۆ ڕابکێشێ، ئەویش لە پاداشتی کارەکەیدا خواردنی چاکی بداتێ و، لە شوێنێکی شیاوی بەخۆیدا جێگەی بۆ دابین بکات، بەڵام دیارە ئەسپەکە داواکەی پەسند نەکرد.

زۆری نەبرد زستان داهات و، واش ڕێککەوت ئەو زستانە بارانێکی وا نەباری، بۆ بەهاریش گیاوگۆڵ کەم بوو، ئیتر ئەسپەکە لەبەر کەم خۆراکی هیوابڕاو بوو، بیری لەوە کردەوە، کە بچێتەوە لای بازرگانەکە و، داوای لێبووردنی لێ بکات، بەڵکو کاری پێ بکات.

ئەوەبوو ئەسپەکە ئەمجارەیان ڕازی بوو بەوەی گالیسکەکەی بازرگان ڕابکێشێ، بەرامبەر بەخواردنی زۆر و مانەوەی لە تەویلەیەکی گونجاودا.

یەک دوو ساڵ ئەسپەکە بەم حاڵە ڕای بوارد، بۆ ساڵی سێیەم زستانەکەی تەڕ بوو، بۆ بەهاریش گیاوگۆڵێکی یەکجار زۆر لەو دۆڵ و دەشت و بنارەدا سەوز بووبوو، ئەسپەکە دڵی کەوتە لێدان بۆ ئەوەی بەئازادی لەم دەشت و بنار شاخانە بژیێت، بەڵام هەرچەندی دەیکرد بۆی نەدەکرا لەچنگ بازرگانەکە ڕزگاری بێت...

بۆیە هەر لەو ڕۆژەوە هەموو ئەو ئەسپانەی لە چۆلەوانی دەدین پێی دەگوتن:

"هاوڕێکانم ئەگەر بۆ تاکە ڕۆژێکیش بێت نەکەن دەستبەرداری ئازادیی خۆتان بن، چونکە لە دنیادا هیچ شتێک هێندەی ئازادی خۆش و پیرۆز نییە".

هەولێر ١٩٩٣

* چیرۆکێکی چیرۆکنووسی عەرەب (زەکریا تامر)ەو، بەکورتە دەسکارییەک کردوومەتە کوردی.
* ئەم چیرۆکەم لە ژمارە (١٨٢٩)ی ڕۆژی ١٩٩٣/١٢/٢٤ی ڕۆژنامەی (برایەتی)دا بڵاوکردۆتەوە.





# زیلان یارمەتی داپیرەی دەدات

کاتێ کە زیلان لە قوتابخانە گەڕایەوە هەتا بڵێی شاد و خۆشحاڵ بوو، لە دوورەوە هاواری دەکرد:

"داپیرە... داپیرە، سەیری بڕوانامەکەم بکە، بزانە چ پلەیەکی بەرزم بەدەست هێناوە".

داپیرەی بڕوانامەکەی وەرگرت، بەڵام لەبەر ئەوەی چاویلکەکەی لە چاو نەبوو، زۆریش بەدوایدا گەڕاو بۆی نەدۆزرایەوە، نەشیدەزانی لە کوێی داناوە، بۆی نەکرا سەیری بڕوانامەکە بکات و وازی لێ هێنا.

دوای ئەویش زیلان ماوەیەکی باش بۆی گەڕا، سەر ڕەفەکانی ژوورەکەی تەماشا کرد، ژێر مێزەکەی ژووری میوانانی بۆ گەڕا؛ بەڵام بێ سوود بوو، بۆی نەدۆزرایەوە، بیری بۆ ئەوە چوو ژێر قەرەوێڵەکەشی بۆ بگەڕێ.

دوای ماوەیەک گەڕان، چاویلکەکەی لەژێر قەرەوێڵەکە و، لە نزیک دیوارەکە دۆزییەوە.

داپیرە زۆر سەرزەنشتی زیلانی کرد و، گوتی:

"لە بیرتە، کە دوێنێ داوام لێکردی بۆمی بدۆزیتەوە، کەچی بەلاتەوە گران بوو، ئەی چۆن ئەمڕۆ وا بەئاسانی دۆزیتەوە؟!"

زیلان لە شەرمان سوور هەڵگەڕا، هەر لەو ڕۆژەوەیش بڕیاری دا، کە لەمەو دوا بەردەوام یارمەتی داپیرەی بدات و، هەرگیز ئەو یارمەتیدانەش بە بەرژەوەندیی خۆیەوە گرێ نەدات.

هەولێر: ١٩٧٩/٧/٢٢

* سەرچاوە: ژمارە (١٢٧٢)ی ڕۆژنامەی (طریق الشعب)ی ڕۆژی ١٩٧٧/١٢/٨، وە: (هیفاء العامل).
* ئەم چیرۆکەم لە ژمارە (١٨٥٢)ی ڕۆژی ١٩٩٤/١/٢١ی ڕۆژنامەی (برایەتی)دا بڵاوکردۆتەوە، دوای ئەوە بەدەسکارییەوە کردوومە کوردی.





# بێچووە مەیموونەکە

بێچووە مەیموونەکە لەنێو جەنگەڵەکەدا گوێی لە دەنگەدەنگێکی زۆر بوو، لە خۆشیانا هاواری کرد و خۆی ڕاتەکاند تاوەکو لە باوەشی دایکیدا ڕزگاری بێت.

دایکی بەتاو لە خەو ڕاپەڕی و خەبەری بووەوە، گورج بێچووەکەی لە باوەش گرت، زۆری پێ نەچوو ئەویش گوێی لە دەنگی شێرێک بوو، بەترسەوە بە بێچووەکەی گوت:

– "بێچووە شیرینەکەم، وریابە شێر هات!"

* بێچووەکەی گوتی:

– "دایە گیان، وازم لێ بێنە با بچم یاری لەگەڵدا بکەم"

– ئەوە دەڵێی چی! دەزانی هەر لێی نزیک بیتەوە دەتخوات.

بێچووە مەیموونەکە سەری خستەوە نێو باوەشی دایکییەوە و، بەترسەوە گوتی:

– "ئەی دڕندە!".

لەپڕ دەنگێکی دیکە بەسەر دارەکانەوە بەرز بووەوە، بێچووە مەیموونەکە هەڵسایەوە و، گوتی:

– "دایە گیان، ئەی ئەمەیان چییە؟"

* دایکی گوتی:

– "ڕۆڵە شیرینەکەم، ئەمەیان بازە".

– ئای کە چەند جوانە! دە واز بێنە با بچمە لای.

– ڕۆڵە گیان وریابە، نەچی ئەگینا دەتبات بۆ بێچووەکانی خۆی و، دەرخواردی ئەوانت دەدات.





بێچووە مەیموونەکە شڵەژا و گوتی:

– "دایە گیان وا دیارە ئەم جەنگەڵ و دارستانە، پڕیەتی لە دڕندەی دوژمن بەیەکدی".

– نەخێر بێچووە شیرینەکەم، ئێمە لەم دارستانەدا دۆستی چاکیشمان هەن، وەکو: کۆتر، بولبول، پەپوولە و زۆر گیانداری دیکەش.

جاریکی دیکە لەپڕ دایکی گوێی لە دەنگێک بوو، تاوێ بێدەنگ بوو، بێچووەکەی هەڵسایەوە و سەیرێکی ژێر دارەکانی کرد، گیانلەبەرێکی بینی بەنێو دارستانەکە دەگەڕا، لەبەر خۆیەوە گوتی:

– "ئای کە ئەم گیانلەبەرە چەند لەمن دەکا، تەنها ئەوە نەبێت، کە ئەویان کلکی نییە".

دایکی لە خۆشیانا حەپەسا و، دەستی بەچەپڵەلێدان کرد و، بێچووەکەشی بەدەنگێکی نزمەوە گوتی:

– "دایە گیان، وریابە ئەگینا ئەم دڕندەیە گەر گوێی لە دەنگت بێت، سەردەکەوێتە سەر دارەکە و دەمانخوات".

* دایکی گوتی:

"بێچووە شیرینەکەم، ئەمەیان دڕندە نییە، بەڵکو چاکترین و دڵسۆزترین دۆستی ئێمەیە و، پاسەوانی ئەم دارستانەیە".

پاسەوانی دارستانەکە لەپڕ سەری بەرز کردەوە و بەدەست ئاماژەی بۆ بێچووە مەیموونەکە کرد و، ئەویش بەزەردەخەنەیەکەوە گوتی:

– "مۆزێکم بدەرێ!".

* دایکی گوتی:

"بێچووە ئازیزەکەم، بچوو بۆ لای، وا بانگت دەکات".

– دایە گیان، ئاخر لەوە دەترسم بمخوات!

– نەخێر ڕۆڵە شیرینەکەم مەترسە ناتخوات، بەڵکو تۆی خۆش دەوێت و، دیارە دەیەوێ مۆزیشت بداتێ.

بێچووە مەیموونەکە بەپەلە لە دارەکە دابەزیە خوارەوە و لە پاسەوانی

دارستانەکە نزیک بووەوە و، مۆزێکی لێ وەرگرت و، خێرا خێرا مۆزەکەی دەخوارد و چەپڵەشی لێدەدا.

بەڵام ئەوەی زێتر بێچووە مەیموونەکەی سەرسام کردبوو، ئەوەبوو، کە پاسەوانەکە نزیک بووەوە، زۆر بەگەرمییەوە ماچی کرد و، تاوێکیش خستیە نێو باوەشیەوە و، یاری دەگەڵدا دەکرد.

* ئەم چیرۆکە، چیرۆکنووسی منداڵان (طلال حسن) بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی و، بەدەستکارییەکی کەمەوە کردوومەتە کوردی.
* لە ژمارە (٩٩٩)ی ڕۆژی ١٩٨٨/٨/١٨ی ڕۆژنامەی هاوکاریدا بڵاوم کردۆتەوە.





## کەڵەشێر و ڕێوییە پیرەکە

کەڵەشێرەکە دوای ئەوەی بانگی بەرەبەیانی دا و لێ بووەوە، بۆ تاوێ چاوەکانی نووقاند، بەڵام بەر لەوەی خەو بیباتەوە، گوێی لە خشپەی پێیەک بوو، کە چاوی کردەوە بینی وا ڕێوییە پیرەکە لێی نزیک دەبێتەوە، لە شوێنی خۆیەوە باڵەفرەیەکی کرد و چووە سەر دارەکەی نزیکییەوە و، لەسەر چڵێکیا وەستا و، لە ترسانا دڵی بەتاو لێی دەدا.

* ڕێوییە پیرە شڵەژاوەکە گوتی:

"کاکی کەڵەشێر، بۆ وا بەسەرسامییەوە سەیرم دەکەی؟ چی ڕوویداوە؟ دەڵێی بەنیاز خراپم دەزانی، دۆستە ئازیزەکەم هەقی خۆتە، چونکە تا ئێستایش هەر لەسەر بیروباوەڕی باب و باپیرانت دەڕۆی و، ئێمەمانان بەنیاز خراپ دەزانی!

دە وەرە خوارەوە با ئەم نامەیەت بدەمێ".

* کەڵەشێر بەسەرسامییەوە! نامە، کێ نامەی بۆ ناردووم؟!

– دۆستی ئازیزم، لەلایەن بەرەبەیانەوە بۆت هاتووە؛ بەڵام دەزانی زۆر لێت زویر بووە.

جا بۆ زویر دەبێت، خۆمن هیچم نەکردووە، کە پێچەوانەی ئارەزووی ئەو بێت.

– هاوڕێی خۆشەویست پیر بووی، هەقی خۆتە گەر بەرەبەیان و بەیانی لە یەکتری جیا نەکەیتەوە.

* کەڵەشێرەکە بەهەڵچوونەوە هاواری کرد و گوتی:

"ئەمەیان فڕی بەسەر ڕاستییەوە نییە".

– جا بۆ لەمن زویر دەبی، دەفەرموو لەگەڵ مندا وەرە و خۆت ئەم قسەیەی پێ بڵێ، چونکو ئەو ئێستا وا لەنێو دارستانەکەدا چاوەڕێتە و، دەیەوێ بەپەلە چاوی پێت بکەوێت.



– کەڵەشێرەکە خەریک بوو دابەزێ و لەگەڵ ڕێوییە پیرە بەرەو دارستانەکە بچێت، لەپڕ دەنگێک بەرز بووەوە و هاواری کرد:

"کوکو... کوکو".

– ڕێوییە پیرەکە هەردوو گوێچکەی بەرز کردنەوە و، بەشڵەژاوییەوە هاواری کرد و گوتی:

"ئەو گەمژەیە کێیە لەم کاتەدا وا هاوار دەکات؟".

– لە پەنا دارەکەوە، سەگێکی گەورە سەری هێنایە دەر و گوتی:

"ئەوە منم مام ڕێوی!"

ڕێوییە پیر لە شوێنەکەی خۆیدا سارد بووەوە و تاسا، ویستی ڕابکا و ڕزگاری بێت، بەڵام سەگە گەورەکە ڕێگەی پێگرت و پێی گوت:

"مام ڕێوی وا دیارە پیرێتی بەچاکی کاری تێکردووی، تەنانەت دەنگی کەڵەشێر و سەگ لە یەکتری جیا ناکەیتەوە، دەفەرموو تۆ لەگەڵ مندا وەرە و پێشم کەوە".

– ڕێوییە پیر بەسەرسامییەوە".

"بۆ کوێ بێم؟".

– بۆ لای ئەو شوانەی، کە هەفتەی پێشوو کەڵەشێرەکەیت خواردووە، ئەو دەیەوێت چاوی بەجەنابتان بکەوێت.

– ڕێوییە پیر بەهاوارەوە:

"بەڵام من کەڵەشێرەکەی ئەوم نەخواردووە، بەڵکو لای خۆمم داناوە و بۆی بەخێو دەکەم، گەر باوەڕیشم پێ ناکەن، ئێوە لێرە بوەستن هەر ئێستا دەچم لە ماڵەوە بۆتانی دەهێنمەوە".

– سەگەکە سەرێکی لەقاند و گوتی:

"نەخێر من کارەکەم بەپەلەیە و ناتوانم لەوە زێتر بوەستم، دەبێ هەر ئێستا لەگەڵ مندا بێی، چونکە شوانەکە پێویستی بەکەپەنکێک هەیە و، دەیەوێ لە پێستەکەی بەڕێزتان کەپەنکێکی جوان بۆ خۆی دروست بکات".

– ڕێوییە پیرە، کە ئەم قسەیەی گوێ لێ بوو، تەزوویەک بەهەموو گیانیدا هات و، سەیرێکی ئەم لا و ئەو لای خۆی کرد، بەڵکو یەکێ فریای کەوێ، پاشان هاوارێکی





کرد و گوتی:

"سەیرکەن... سەیرکەن، بزانن ئەوە کێیە بەرەو ڕوومانەوە دێ!!:.

* کەڵەشێر و سەگە گەورە ئاوڕێکیان دایەوە سەیری ئەو شوێنەیان کرد، کە ڕێوی ئاماژەی بۆ کرد، بەڵام کەسێکیان بەدی نەکرد، کە ڕووی خۆیان وەرگێڕا، ڕێوییە پیر تۆزیشی نەمابوو، ئیتر بەو فێڵە ڕێوییە پیر کەڵەشێر و سەگە گەورەکەی خەڵەتاند و خۆی ڕزگار کرد.

لەو لاشەوە سەگە بۆری زەبەللاح بەدەم ڕاکردنەوە بەدوای مام ڕێویدا دەنووزایەوە و، دەیگوت:

"هەی گەمژە، وا دەزانی بەڕاکردن لە دەست مندا ڕزگارت دەبێت، شەرت بێ بۆ هەر کوێیەک بچیت هەر بەدواتەوە بم، تا هەموو تۆڵەکەیت لێ دەکەمەوە".

* ئەم چیرۆکە، چیرۆکنووسی منداڵان (طلال حسن) بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی و، منیش بەدەستکارییەوە کردوومەتە کوردی.
* لە گۆڤاری کاروانی ژمارە (٦٠)ی مانگی تشرینی یەکەم و دووەمی ساڵی ١٩٨٧، لە لاپەڕە (٧٦، ٧٧)دا بڵاوم کردۆتەوە.





## ئەو بێچووە ورچەی لە هەواڵی زستانێی دەپرسی

هەرچەند جارێ بێچووە ورچەکە بیویستایە شتێ لەبارەی دەوروبەری خۆی بزانێت، ڕووی لە دایکی دەکرد و لێی دەپرسی، ئەویش زۆر سادە و ساکار وەڵامی دەدایەوە.

ڕۆژێکیان لەپڕ لە دایکی پرسی دەکرێ باسی زستانی بۆ بکات، ئەویش دڵی نەشکاند و گوتی:

"بێچووە شیرینەکەم، بمبوورە کە ناتوانم بۆتی باس بکەم، چونکە من زستانم نەدیوە".

بێچووە ورچ زاری خۆی دادڕی و، ددانەکانی جیڕکردنەوە و، گوتی:

"چی، نەت دیوە! چۆن ئەو هەموو تەمەنەت بەسەر بردووە؟!".

دایکەکەی وەڵامی دایەوە و گوتی:

"ڕۆڵە گیان، دڵنیابە کە تۆش وەکو من هەرچەند بژیت زستان نابینیت".

بێچووە ورچ سەرسامی نێو چاوانی داگرت و، کەوتە بیرکردنەوە، ئینجا دایکەکەی بەزەردەخەنەیەکەوە پێی گوت:

"ڕۆڵە شیرینەکەم، بیرت نەچێ کە ئێمە لەو گیاندارانەین خوێنمان ساردە و، بەدرێژایی وەرزی زستان لەنێو ئەشکەوتان دەخەوین".

ئەوسا بێچووە ورچ نەختێ وەهۆش هاتەوە و، بەگورجی دەرکەوتە دەرەوە و گوتی:

"کەواتە دەچم لەیەکێ لە هاوڕێکانم دەپرسم، بۆ ئەوەی باسی زستانم بۆ بکات".

زۆری نەبرد گەڕایەوە و لە خۆشیاندا هەڵدەپەڕی و، هەر لە دوورەوە بانگی دایکی کرد و، گوتی:

"دایە گیان... دایە گیان، وەرە با من باسی زستانت بۆ بکەم، وەک چۆن ژیشکی هاورێم بۆی باس کردووم".






دایکیشی بەزەردەخەنەیەکەوە سەری بۆ لەقاند و قسەکەی پێ بڕی و، گوتی:

"بێچووە شیرینەکەم، گوێ لە ژیشک ڕامەگرە، چونکە ئەویش وەک ئێمەمانان بەزستان دەخەوێت".

بێچووە ورچ لە هەنبەر ئەم وەڵامەدا بێدەنگی دایگرتبوو، دایکیشی لەسەر قسەکانی بەردەوام بوو و، گوتی:

"ڕۆڵە ئازیزەکەم، گەر دەتەوێ لەم مەسەلەیە تێبگەی و دڵنیا بیت، بڕۆ لە کەروێشک و ئاسک و ڕێوی بپرسە، چونکە ئەوان لە گیاندارە خوێن گەرمەکانن و، وەکو ئێمە نین بەزستان دەرنەکەون، ئەوان هەموو ساڵێ زستان دەبینن و بەدەرەوەن و درکی پێ دەکەن".

* سەرنج: ئەم چیرۆکە، چیرۆکنووسی منداڵان (طلال حسن) بەزمانی عەرەبی نووسیویەتی و، منیش کردوومەتە کوردی.

## فیلێکی شەرمەزار

منداڵە خنجیلانەکان، حیکایەتخوان دەگێڕنەوە و دەڵێن:

سەردەمانێکی زوو لە وڵاتی هیندستانێ پیاوێکی هیندی فیلێکی گەورە و زەبەللاحی هەبوو، کابرا لەبەر چاوچنۆکیی خۆی هێندە خواردن و خۆراکی نەداوەتە فیلەکە تاپێی تێر ببێت، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا هەرچی کارێکی سەخت و گران بووە پێی کردووە.

منداڵە ئازیزەکان، دەزانن لە بەرامبەر ئەوەدا فیلی بەستەزمان چی کردووە؟!

ڕۆژێ لە ڕۆژان فیلەکە ئارامی لێ بڕاوە و هێندە بێزار و توڕە بووە، گورج خاوەنەکەی خۆی شێلاوە تا مردووە، ژنی کابرای هیندیش، کە بەهەواڵەکەی زانیوە دەستی بەگریان و ڕۆ ڕۆ کردووە و، لە تاوانا منداڵەکانی وەدوو خۆی داون و، ڕووی لە فیلەکە کردووە.

کاتێ کە گەیشتۆتە بەردەمی فیلەکە، منداڵەکانی خستوونەتە بەرپێی فیلەکە و گوتوویەتی:

ئەی فیلی بێ بەزەیی و نمەک حەرام، تاوێ بەر لە ئێستا باوکیانت شێلا و کوشتت، دەفەرمۆ ئێستا ئەمانیش بکوژە و ڕزگاریان کە!

فیلەکە لە بەرامبەر ئەم دیمەنە کاریگەر و خەم ئامێزەدا شەرم و شوورەیی دایدەگرێ و، ئارەقەیەکی ڕەش و شین دەکات و، لە شوێن خۆیدا دەتاسێ.

منداڵە ئازیزەکان،

فیلی شەرمەزار و کەتنکەر بۆ ئەوەی هەڵەکەی خۆی ڕاست بکاتەوە، هیچ









سێ و دووی لێ ناکا و، بە خەرتوومەکەی، کوڕە گەورەکەیان هەڵدەگرێ و، دەیخاتە سەر پشتییەوە و دەڕوات، ئیتر هەر لەوساوە تا ئەمڕۆیش فیلەکە گوێڕایەڵی ئەو منداڵەیە و، هەر کار و فرمانێکی پێی بکات لێی دوا ناکەوێ و جێبەجێی دەکات و، بەڕووی خاوەنەکەشیدا هەڵناشاخێ و، قەتیش زوویر نابێت.

* ئەم چیرۆکە عەبدولڕەحمان مەلا قاسم وەریگێڕاوەتە سەر زمانی عەرەبی و، لەیەکێ لە ژمارەکانی (مجلتی) بڵاوی کردۆتەوە و، منیش بەدەستکارییەوە کردوومەتە کوردی.

# برووسکەی ژیشکێک

منداڵە ئازیزەکان، دەڵێن، ڕۆژێکیان ژیشکێک برووسکەیەک بۆ هاوڕێکانی خۆی لە دارستاندا دەنێرێ و، تێیدا دەڵێ:

"هاوڕێ ئازیزەکانم، ئاگر لە کێڵگەکەم بەربووە، تکاتان لێ دەکەم، بەپەلە فریام کەون و ڕزگارم کەن".

بەڵام لەبەر ئەوەی هەر تەنیا ژمارەیەکی کەم باوەڕ بەقسەکانی دەکەن، بۆیە زۆربەیان دەڵێن:

"جا توخوا ئەو ژیشکە تەمبەڵە خۆی هەیە هەتا کێڵگەی هەبێت، سەیرە، ژیشک و کێڵگە کوجا مەرحەبا!".

لەم لاشەوە ژیشکی بەستەزمان لەبەر ئەوەی کەس باوەڕی پێ ناکات بەتاقی تەنیا خۆی دەکەوێتە ئاگر کوژاندنەوە، بۆ ئەوەی ئەو کێڵگەی، کە تازە دایمەزراندووە لە ئاگر کەوتنەوە بپارێزێ، بەڵام دیارە بەتەنیا هیچی بۆ ناکرێ و، ئاگرەکە سەرجەم کێڵگەکە دادەگرێ و، دەیسووتێنێ.

دوای چەند کاتژمێرێک ئاگرەکە زیاتر پەرە دەستێنێ و، گڕەکەی زێتر بەرز دەبێتەوە، ئەمجارەیان ئاگر لە هەموو لایەکی دارستانەکەشدا هەڵدەستێ و گڕەکەی بەرەو ئاسمان بەرز دەبێتەوە، ئینجا هاوڕێکانی لە هەموو لایەکەوە بەفریای دەگەن و، هەڵمەت دەبەن تاوەکو ئاگرەکە بکوژێننەوە، بەڵام هەر هەموویان لەبەر گڕی ئاگرەکە هیچیان بۆ ناکرێ و هەڵدێن.

لەم لاشەوە ورچە بۆر بەداماوی و پەشۆکاوییەوە ڕوو لە هەمووان دەکا و، دەڵێت:

"قوڕتان بەسەر ژیشکی هاوڕێمان زەرەرەکەی هەر ئەوەبوو کێڵگەکەی سووتا و تەواو، بەڵام ئێمە لەبەر بێ باوەڕی و خراپەکاریی خۆمان، هەر هەموو دارستانەکەمان لە کیس چوو و سووتا، دەجا هەڵیگرنەوە دەی!!".

هەولێر: ١٩٩٦

* سەرنج: بیرۆکەی ئەم چیرۆکە، لە چیرۆکێکی عەرەبیەوە وەرگیراوە.
* لە ژمارە (٢٠٤)ی ساڵی (٥٢)ی ڕۆژنامەی ڕێگەی کوردستانی ڕۆژی (٥/٦/١٩٩٦)دا بڵاوبۆتەوە.





# یاری کلیلەکان

نەبەز کوڕێکی تەمەن هەشت نۆ سالان بوو، تا بلێی ئێسک سووک و قسە خۆش بوو، ڕۆژێ لە ڕۆژان کلیلەکانی باپیری وەردەگرێ و یارییان پێدەکات، بۆ دوای نیوەڕۆیە نەبەز لەبیری دەچێتەوە، کە کلیلەکانی لە کوێ داناون، ئیتر بۆ ئەوەی لەبەردەم باپیری شەرمەزار نەبێت، دەکەوێتە گەڕان و پشکنین، هەموو شوێنێکی ماڵەوە دەگەڕێت، بەلام نایاندۆزێتەوە.

لەم لاشەوە باپیرەی، کە دەبینێ نەبەز ژێر سەرینەکانی ژووری میوانان دەگەڕێ و شڵەژاویشە، لێی نزیک دەبێتەوە و، دەپرسێ:

"ئەرێ ڕۆڵە، نەبەز گیان پێم نالێی بەدوای چیدا دەگەڕێی؟".

نەبەز بەشڵەژاوییەوە سەر بەرز دەکاتەوە و زمانیشی تێک دەئالێ و، دەڵێ:

"باپیرە گیان، ببوورە بەدوای هیچ شتێکدا ناگەڕێم، بەڵکو بۆ خۆم یاری دەکەم".

باپیری لێی نزیک دەبێتەوە و دەڵێ، چ جۆرە یارییەک دەکەیت ڕۆڵە گیان؟!

نەبەز خێرا و بێ بیرکردنەوە دەڵێ:

"باپیرە گیان یاریی کلیلە بزربووەکان دەکەم".

باپیری زەردەخەنەیەک دەیگرێ و لەوە تێدەگات، کە نەبەز بۆ وا نیگەران و شڵەژاوە، گورج پێی دەڵێ:

"زۆر چاکە، کەواتە نەبەز گیان ئەو یارییەی تۆ دەیکەیت ئەوا من بردمەوە، چونکە من ئەمڕۆ بەیانی کلیلەکانم لەسەر مێزی نانخواردن دۆزینەوە و، ئەوەتان وا لای منن و چیتر بۆیان مەگەڕێ".

هەولێر ١٩٩٩/٨/٢٣

* سەرچاوە: لە گۆڤاری (مجلتی) ژمارە/ (٣٩)ی ساڵی (١٨)ی ڕۆژی دووشەممە ١٩٨٧/٩/٢٨ وەرگیراوە، بەڵام ناوی نووسەرەکەی بەسەرەوە نەبووە.





## ماسییەکی گەورە و یەکێکی بچووک

جارێکیان لەیەکێ لە ڕووبارەکانی کوردستاندا ماسییەکی گەورە و یەکێکی بچووک دەگەنە یەکتری، گەورەکەیان بەفیزێکەوە بەبچووکە کە دەڵێت:

"دەزانی تۆ هێندە بچووکی، کە من دەتوانم هەر ئێستا بتکەم بەپاروویەک و بتخۆم".

ماسییە بچووکەکە تاوێ بەم قسانە خەمبار و نیگەران دەبێ و، دەکەوێتە بیرکردنەوە.

زۆری پێ ناچێ هەردوو ماسییەکە بەجووتە دەکەونە تۆڕی ڕاوچییەکەوە و دەگیرێن، کاتێکیش کە ڕاوچییەکە تۆڕەکە بەرز دەکاتەوە، لەپڕ ماسییە بچووکەکە لەیەکێ لە کونەکانی تۆڕەکەوە دەخزێتە دەرەوە و، ڕزگاری دەبێت، بەڵام ماسییە گەورەکە هیچی بۆ ناکرێ و هەروا دەمێنێتەوە.

ئینجا ماسییە بچووکەکە لەبەر خۆیدا دەڵێ:

"ئێستا بۆم دەرکەوت، کە گیانلەبەر گەر بچووکیش بێت، بەڵام سەنگ و توانا و تایبەتمەندێتی خۆی هەیە و، هەر ئەوەیشە وایکردووە بتوانێ درێژە بەمان و ژیانی خۆی بدات".

هەولێر: ١٩٩٩/٨/٢٣

* سەرچاوە: گۆڤاری (مجلتی) ژمارە (٣٩)ی ڕۆژی ١٩٨٧/٩/٢٨، لاپەڕەی سێیەم.





## جرجێکی شەڕخواز

منداڵە خۆشەویستەکان، دەگێڕنەوە و، دەڵێن:

ڕۆژێکیـان دار تووە گـەورەکـەی نێـو دارسـتـانەکـە لـەپڕ ڕاچڵـەکی، پاش ئەوەی ڕەگەکانی هاواریان لێ هەستاو تێکڕا دەیانگوت:

"ئای خۆ ئەوە جرجە شـەڕخوازەکە خـەریکە دەمانخوات، گـەڵا سـەوزە جوانەکان گریان دەرووی قـوڕگی گرتبوون و، لقە بەرز هەڵچووەکانیش لە ترسـان دەلەرانەوە و، چۆلەکە و کۆترەکانیش خەم و پەژارە دای گرتبوون".

لەم لاشەوە کوندەبۆکە هەستی بەفرمێسکی گەرمی گەڵا و، ترس و لەرزی لقەکان و، خەمی کۆتر و چۆلەکەکان کرد و، گوتی:

"پێم ناڵێن بۆ وا مات و داماون، چی ڕوویداوە؟"

دارتووەکە وەڵامی دایەوە و گوتی:

"ئەی نەتزانیوە جرجی شەڕخواز و ناپەسند دەیەوێ ڕەگەکانم بخوات".

کوندەبۆکە نەختێ داماو، یەک دوو جار سەری بۆ هەژاند و، گوتی:

"دارتووی هاوڕێم، هیچ خـەم مـەخـۆ و مـەترسـە، هەر هێندەم لەسـەر ڕاوەسـتـە تاوەکـو تاریکی شـەو دادەکـەوێ و، چاوەکـانم توانای بینینیـان دەبێت، دڵنیـابە کـە جرجە شەڕخوازەکەت بۆ ئەنجن بەئەنجن دەکەم".

ئیـتر کە شـەو داهات کوندەبۆکە گڕ لە چاوانی دەباری، لەپڕ چڕنۆکە تیژەکانی لەپشتی جرجەکە گیر کرد و، گرتی و ئەنجن بەئەنجنی کرد و خواردی.

منداڵە ئازیزەکان، بەمـجـۆرە کوندەبۆکە دارتووەکـەی لەچنگ جـرجی شـەڕخـواز ڕزگار کرد و، جاریکی دیکە خۆشی و شادومانی خستەوە دڵی کۆتر و چۆلەکەکان و، گەڵا و لق و پۆپەکانیش نەرم نەرم دەلەرانەوە.

هەولێر: ساڵی ٢٠٠٠

* سەرنج: سەرچاوەی ئەم چیرۆکە گۆڤاری (مجلتی) ژمارە (٤١)ی ساڵی (٢١)ی ڕۆژی (١٩٩٠/١٠/١٨)ەو، لە لاپەڕە (٣٩)ی گۆڤارەکەدا بڵاوبۆتەوە، بەڵام ناوی نووسەرەکەی نەنووسراوە، منیش بەدەستکارییەوە کردوومەتە کوردی.





## کەروێشک و تانجی

جارێکیان تانجییەک حەز بەوە دەکات ببێتە سەگ، بۆ ئەم مەبەستە بەرەو کێڵگەیەک بەڕێ دەکەوێ، لەپڕ چاوی بەکەروێشک دەکەوێت و، پێی دەڵێت:

– تۆ... هەر چییەکی ڕۆژباش.

* من... کەروێشکم.

– منیش تانجیم.

* بەڵام تۆ هەرگیز لە تانجی ناچیت!

– بۆچی؟

* ئەی ئەوە نییە تووکەکەت بۆرە.

* تووکەکەم بۆرە!

* ئەی ئەوە نییە هەردوو کونە لوتیشت تەڕن.

* تەڕ!

ئەی گوایە حەز بەوە ناکەیت لە کێڵگەدا بژیت؟

* بەڵێ.

* کەواتە تۆش وەکو من کەروێشکیت.

تانجییەکە دوای بیرکردنەوەیەکی قووڵ لەبەر خۆیدا دەڵێت:

" دیارە کەروێشک ڕاست دەکات، هەر لەگەڵ ئەم بیرکردنەوەیەدا تانجییەکە تەواو دەگۆڕێ، چونکە ئەو زێتر حەز بەوە دەکات ببێتە سەگ، نەک تانجی بێت".

لەو کاتەدا ڕێوییەکی لەڕێ برسی بەلایاندا تێدەپەڕێ، هەرکە کەروێشکەکە دەبینێ بەرەو ڕووی دەچێ بۆ ئەوەی پەلاماری بدات، بەڵام تانجییەکە لەو وریاتر دەبێ و بواری نادات و، بەرەو ڕووی ڕێوییەکە دەچێت و، پێی دەوەڕێ و، لە دواوەش ددانەکانی لە کلکی گیر دەکات... ڕێوییەکە دەشڵەژێ و هاواری لێ هەڵدەستێ و،





بەدەم ڕاکردنەوە دەڵێت:

"ئاخ... ئاخ!! چ سەگێکی بڵحە".

کە ڕێوییەکە وەدوور دەکەوێتەوە، کەروێشکەکە لەنێو دار و دەوەنەکاندا سەر بەرز دەکاتەوە و، تانجییەکەیش بەفیزێکەوە ڕووی تێ دەکا و، پێی دەڵێت:

"ئێستا بۆم دەرکەوت، کە تۆ لەسەر هەق بوویت؛ بەڵام زۆریش نا، چونکە لە ڕاستیدا من تانجی نیم، بەڵکو سەگم".

هەولێر: ١٩٨٨/٨/٨

* سەرچاوە: گۆڤاری (أنباء موسکو)ی ژمارە (٥)ی ساڵی ١٩٧٨، نووسینی: (فیکتۆر لۆنین)
* لە ژمارە (١٠٠٩)ی ڕۆژی ١٩٨٨/٩/٢٢ی ڕۆژنامەی هاوکاری و بڵاوم کردۆتەوە.